**له بڵاوکراوەکانی گۆڤاری ئاینده**

# مردوویەک ئاگای لە هەمووانە

سەباح ڕەنجدەر

سلێمانی ــ ٢٠٠٧

ناوی کتێب: مردوویەک ئاگای لە هەمووانە
نووسەر: سەباح ڕەنجدەر
نەخشەسازی: سەرکەوت وەلی
تیراژ: (1000) دانە
نرخ: (١٥٠٠) دینار
لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (      )
ساڵی (٢٠٠٧)ی دراوەتێ

## شیعر و چالاککردنی هەستەکان

سەیرکردن دەستپێکێکی پڕ بەهایە و یەکەم وروژان لەوێوە دەست پێ دەکات. دەتوانم ڕۆژێ چەندان کاتژمێر بەرامبەر خاڵێک بوەستم و هەموو هەستەکانم بەکار بهێنم. بۆ ئەوەی بزانم ئەم خاڵە چۆن دەکرێتەوە. لە هەر ڕۆژێکدا چاوەڕوانی زۆری ڕووداو دەکەم بۆ زانین، بەڵام بۆ سەرناسین و بەمانا و دیمەندارکردنی ژیان لە ئاسۆ و دووربیەکانی شیعرەوە چاوەڕوانی ڕوودانی خەیاڵی خۆمم و سەرچاوەی سرووش و پەیامی بەهرەش لە بەرچاو دەگرم. هیچ ڕۆژێکیش لە بوونم تێنەپەڕیوە بەبێ ئەوەی تێیدا بیر لە شیعر و چێژە مەستکەر و سرووشهێنەکانی نەکەمەوە و خەباتی گیانیی بۆ نەکەم. مەرجیش نییە نووسیبێتم.

دەشزانم هەندێک کپیی خود و گیانی مرۆڤ لە ئارادان تەنیا شیعر لە توانایدا دەبێت شتیان لە بارەوە بڵێت و پڕۆژەی جوانناسییان دامەزرێنێ، پاشان بۆنی ناتەواوی گەردوون بکات.

کاریگەری و خەسڵەتی ناساندنیان لە شیعرییەتدا خەست بکاتەوە بۆ زادەی توانا و گەشکردنەوەی بیرەوەری، لە هەمان هێڵدا تەقاندنەوەی خاڵی پێکهێنەری بیرەوەری لە ئاگاییەکی

ڕووندا، یان گەوهەرێک لەو بۆشاییە هەڵداتە ئاسمان کە لە خود و گیان پەیدا بووە، خود و گیانی داهێنەریش هەمیشە لە بۆشاییدا لەگەڵ ئاسۆیەکی گەورەتر لە ئاسۆی واقیع سۆسەیەتی. ئەمە کێشەیەکی گرینگە لەمێژە مرۆڤی هەستیار پێوەیەوە خەریکە و گرژی هەستەکانی تێدا خاو دەکاتەوە.

پرسیارێک لەمێژە بووەتە مایەی سەرسوڕمانی باڵندەناسەکان، ئایا بۆ هێزی باڵی باز بۆ بەرزبوونەوە لە هێزی باڵی قەتێ بەهێزترە، هێزی باڵی قەتێش بۆ نیشتنەوە لە هێزی باڵی باز بەهێزتر لەنگەر دەگرێ. بەرزبوونەوە و نیشتنەوەش دوو ئاراستەی سەرەکین بەهرە و بەرهەم لە ژیان وەردەگرن.

شیعری ڕاستەقینە جەستەیەکی تەواوە، خانەکانی جەستەی مرۆڤ چەندە پێوەندییان پێکەوە هەیە و وزەیان دەڕژێنە ناو یەکترییەوە، هونەرەکانی شیعر هێندەش زیاتر هەڵدەڕژێنە ناو یەک و شیعرییەت لە جەستەی دەقدا پێک دەهێنن.

لەمێژە ئەم بۆچوونە باوە دۆخێکی نەگۆڕی گرتووە و هەستەکان هەڵدەبزرکێنێ.

شیعر دەربڕی گیانی سەردەمە. من خۆم لەم بۆچوونە جیا دەکەمەوە و ڕادەگەیەنم شیعر دەربڕی هێز و گیانی سەردەم نییە. چونکە پێکهێنەری هێز و گیانی سەردەم کۆیە و شیعریش هێز و گیانی تاکی جوانیبەخشە. بەشی زۆری هێز و گیانی کۆ توندوتیژی بەرهەم دەهێنێ و خۆی بەدەسەڵاتەوە گرێ داوە، هێز و گیانی جوانیبەخش هێز و گیانێکی گەرم و نیان و خۆ بەدوورگرە لە دەسەڵات و توندوتیژی. بۆیە ئەم دەربڕینە هەڵەبەرە و پێویستە

گومانی بخرێتە سەر.

چرکە دەگمەنەکان بیرەوەری بەرهەم دەهێنن. شاعیر گەمە جیاکانی بیرەوەری و ئەدەب ئەزموون دەکات، بەو مانایەی شیعری فرە دەنگ و نوێبەخش تانوپۆی لە ناو هەموو لکەکانی ئەدەب و نووسین دەچنێ و خۆی لە دیوی نهێنییان تاقی دەکاتەوە، پنتی باڵای لک و نهێنییەکانیش خەملان و چالاککردنی هەستەکان، لەم بارەدا وەرگر وەک توخمێکی زاڵ و کارای نووسین ئیش لە کەش و کایەکان دەکات.

هەمیشە ویستوومە کارەکتەرێکی چالاک بم لە ناو شیعردا نەک وەرگرێکی تەمبەڵ و گوێڕایەڵ. کە بەشێکی زۆری شیعری کوردی کەسی تەمبەڵ و گوێڕایەڵی بەرهەم هێناوە. چونکە ئیلهامی لە سروشتی تەمبەڵ وەرگرتووە و نەچووتە ناو گەردوونی چالاک و پڕ کار و بە زەبر. ڕێکەوتم کردووە لە هەموو جووڵەکانی سەر زەمین ڕاماوم و شیعرم نەدۆزیوەتەوە، بەڵام بڵقێکی سەر ئاو هێڵەکانی بیرکردنەوەی جووڵاندووم و دۆخێکی بۆ دروست کردم خولیاکانی نووسینی تێدا بەدی بهێنم. شیعر هیچ خاڵێک ڕاناگەیەنێ، بەڵکو خاڵ دەکاتەوە. تەنیا شیعرییەتیش یەکەی هەڵسەنگاندنیەتی. دیمەنی بە شکۆ لە زەیندا دەخاتە پاڵ یەک و گیان ڕێک دەخاتەوە.

لە نسکۆ چۆک شکێنەکان شیعر گیانی تاکی هەستیار و جوانیویستی ڕێکخستووەتەوە و خستوویەتییەوە سەر هێڵی بووژانەوە.

هەرچەند جارێک ویستبێتم دەربارەی شیعر بدوێم پرسیاری هاوپەیوەست بەپڕشنگی جوانی تر ڕووبەڕووم دەبێتەوە و ترسێک

دوانەکـەم دوا دەخـات. تەنیـا دەقی فـرە دەنگیش کـە دەنگ و بەردەنگەکان تێیدا یەکتری وەردەگرنەوە و تێکهەڵکێشی یەکتر دەبن، لە سەردەمی خۆیدا بیر دەکاتەوە، لە پێوەندیی نێوان وێنە و رووداوی واقیعی و خەیاڵی و کەسایەتییەکان دەکۆڵێتەوە، بەهەرەش بۆ بەهێزکردنی سروشتی ژیان و بەگەڕخستنی دەبەخشێتەوە و پەرجووی خۆی دەخولقێنێ. کۆ دەنگ بوێر و جەربەزە ڕادەهێنێ و لە دیلییەتی ڕزگاری دەکات، بەهای دۆزینەوەش لەم ڕزگارکردنەدا دەبێتە بوونێکی بەرجەستە و جووڵەی لێوە پەیدا دەبن.

خاوەن دەقی فرەدەنگ گشتبینە و بینینی ئاسمانی و زەویی و خەونی بەڕێوەی دەبا، نەک هەر دەبێ تەنیا تەواوی دەنگ و بەردەنگەکان ئاشق بکات، بەڵکو دەبێت هێزی ئاشقبوون لە یەکە یەکەی دانە پەیڤەکانیش نیشان بدات. بۆ ئەوەی لە ئەفسوونی یەکە یەکەی ئەشقی دانە پەیڤەکان بگەین پێویستە ئەفسوونی ئەشق و شیعر خۆی بناسێن کە ئەفسوونێکە سەرڕێژ لە ئەشق و درووود بۆ خوا و دروستکردنی زمان و ماڵی خوا لەسەر زەمین. ئەو زەمینەی سروشتی هەموو پێویستییەکانی گەشەکردنی ژیانی تێدا ئامادەیە. هێزی نوێکردنەوەی جوانییەکانیش لەناخی شاعیری پەیوەست بە ئەفسوون و خەون بەهێز و چالاکە.

لەمیانی زمانەوە مرۆڤی سەرەتاییەکان دەدۆزمەوە و ئاشکرایان دەکەم، وەک کەسێکی ئێستایش قسەی خۆمیان لە هەناو دەکەم بەفەرمووده و بۆ تا هەتایی لە هەستی چالاکیان جێی دەهێڵم. تێکەڵکردنی زمانی قسەکردنی ڕۆژانەی خەڵک بەشیعرەوە کارێکی پڕ بگرە و بەردەیە چونکە توانایەکی زۆری دەوێ

شیعرییەت بدەیت بەزمانی ئاخاوتنی ڕۆژانە، تا ڕادەیەک هەوڵم داوە ئەو کارە بەجێ بهێنم.

شیعر مێژوویەکی دیاریکراوی نییە، لە دەرەوەی مێژوو ڕێڕەوێک بۆ هاتوچۆکردنی شەق دەکات، وزەیەکی زۆری ڕێگایەکانی تریش بۆ گیانی خۆی ڕادەکێشێ. بەدەگمەنیش نەبێت پێوەندی بەمێژووی نووسینەوە نامێنێت، بەڵکو هەڵگری کۆمەڵێک باری لە پێشینەیە. چرکەی تەقینەوەکە دەبێتە مێژووی نووسینی، چرکەی تەقینەوەش تەنیا ئاواز و ئامادەکردنە و بەس، بەڵکو پێکهاتە و دروستبوونەکە کۆمەڵە بارەکەی پێشینەیە. ئەم کۆمەڵە بارە هەڵگری مانان و چرکەی تەقینەوەکەش فۆرم و هێڵی ڕەوتی بەردەوام دەدات بەو مانایەی کە کۆمەڵێک باری لە پێشینە زاڵە تێیدا و ماڵی شیعر وەک سەرچاوەیەکی پالاوتن و ئاکاری بالا بۆ دیمانەکانی داهێنەری بەخشندە دەکات بەشوێنێکی تاقانە بۆ چالاککردنی هەستەکان و شیعری تێدا دەدۆزێتەوە.

**نیسانی ٢٠٠٦ هەولێر**

## تاج سەر گران دەکات

تاج چاوی لە ئەشق
ڕوون بووەوە و جوانی بەئاگا هێنا
دوای ماوەیەکی کورت کەوتە سۆراخکردنی
ونبووەکانی و بریقەی چاویلکە و دڵنیایی
ئەسپی جڵەو زیوینیشی
لە گۆڕەپانی شێوە پەرستگا
خەڵات کرد بەزوو ورووژانی پەپوولە
ئەفسوونێکی لە چەکەرە و نەرم و شلی گوان
دا بەگژوگیای ئالوودەی
نیاز و مراز لەسەر خوێندراو
گژوگیا کەسوکاری منن

ڕزگاریان کردم لە گەمارۆ
مەرەکەب و کاغەز خۆیان لە ناو ڕێکخست
ئەم سرووشەیان هەڵدا
ژیان و مردن بردنەوە و دۆڕان نین
شیر و
قاوە و
دیوان و
مۆمی دەم بەسووراو و سپیاو
سۆز و سێبووری و بێ پەروایییان
تا گەیشتن بەخۆت بەرز بووەوە
هاوارە بەهانا هاتووەکانت
کە بەدڵێکی بەهێز شوورە دراوە
هەڵدە سەرە ڕێگاکان
نە لەگەڵ سەرەتا کاروانت دەجمێ

نە لە کۆتایی تاسەیەکی بریسکەدار
گیانت دەکات بەجانتایەکی ئامادەکراو بۆ گەشت
لە نامەیەکی تایبەتیدا داوا بکە
پێویستیم بەدەستەیەک پێغەمبەر هەیە
لە ناو گەرمایی دێڕەکانم
هونەری پێگەیینی میوە
بکەن بەبیرکردنەوە و خولیا
ئەی سەمای ڕێشمە و زەنگوڵەی نەرمی
کۆچی بەختەوەری
ئەستێرە بۆیەکراوەکانی
ناو ڕستە سڕەکان لە خەو دابڕژێنە
هەنگ هەنگوینیان بڕییەوە
نەمانزانی ئەو تەشتەی حەوشەمان خۆشبوێ
کە تریفەی مانگی بۆ پاراستین

سڵاوت لێ دەکەم ئەی ئاسوودەیی
بەدڵ ئاوڕێک
لە پاشماوەی برینەکانمان بدەرەوە
کولانەوەیان کێڵگەیەکە مەست و ڕازدرکێن
مۆم تێکۆشەری بنەماڵەی ڕووناکییە
جەنگێکی گەورەی بردووەتەوە
نیشانەکانی خاڵبەندی ژیان
گوێ لەو دەنگانە ڕادەگرن
دەبنە ئاواز
نیشانەکانی خاڵبەندی مردن
گوێ لەو دەنگانە ڕاناگرن
نابنە ئاواز
گوێ گرتن و نەگرتن
بردنەوە و دۆڕان نین

باری دەروونی و دوو ئاراستەن
دەتوانین پێیدا بڕۆین و بێینەوە
بازێکی ڕاونەکراو لە ناو ڕەزێکی خان و مان
لە باوەشی درەختێکی نزم  خۆی هەڵدا
پڕشنگی بەهرە دانەوێڵە و ئومێدی
لە نزیک دەنووک و باڵی دانا
بۆنی حاجیلەی کوتراویش
لە ناو گۆڕەوی و ئاوان
دەنیشێتە شوێن پێیەکانی
وەک پیرۆو دەجریوێنن
بێ چرا کتێب کەسێکی لە بیرکراوە
شەوقی ڕووداوەکانی ساڵ
چەشنی باران
ئاوی سەر بەشەختە بەئاگا دەهێنێ

بۆن و بەرامەمان بۆ دەنێرێتە ماڵەوە
قەڵەمکێشی کۆچکردووان و چەتری گوڵفرۆشێک
پەڕەی زمانن قەت درۆ ناکەن
وایان کردووە
بە وچانەوە درەوشانەوە تەماشامان بکات
درەختی بڵند و لک بەهێز بۆ جۆلانە دەڕوێن
ڕەگیان بەناوچەوانمانەوە گرێ دەدەن
تیشک و سێبەر
ناکۆکییەکانیان خاو دەبێتەوە
مۆسیقایەکی دەوڵەمەند دێتە ناوەوە
کتێبەوانێک کە لە گەڕەکی ئێمە
چووە ناو ڕەش و سپی
بەتاجی کتێبەوە
دێتە یەکەم کۆڵانی شار

تێدەگات ئاو و هەوای
ڕوخساری ڕۆشنی ئەسپە
یان هێزی ڕاوچیی ڕێوی

**تشرینی یەکەمی ٢٠٠٥ هەولێر**

## زمان و دڵی مانگ

پەپوولەیەک لەسەر شانی پێغەمبەرەوە
فڕییە سەر شانی من
تەپەی باڵ و نیشتنەوە
بۆنی خۆشی گڵەسەرن
پێویستییەکانی ڕۆژ هەمووی جوانین
کاتژمێری قورمیشدار
ئامادەت دەکات بۆ بێدارکردنەوەی پەردە
تیشک بەشی خۆی بداتە ژوورەکان
جۆشی قۆریە
کە بەناو دڵی هەڵوەدای کازێوەدا ڕەت دەبێ

باوەشیماڵ پڕ دەکات لە شیرینی
کرۆسک و ددانی شیری تێیدا گەشە دەکەن
داوەڵ
پشووی بێستانەوانە
مەیموون و کەروێشک
خەیاڵیان دەمرێ و بارکەوتوو دەبن
نامەی جەنگاوەرێک
لە ناو دەست و پەنجەی پۆستەچی شار
بانگی کەڵەبابە
ئەستێرەی تاریک و ڕوونی لێ بەگرشە گرش کەوتووە
ئەشقی نەزاو
گیان و لێکدانەوە دەداتە
نازی ڕەنگ لە ناو پەلکەزێڕینە
پەلکەزێڕینە جوانی سەرزەمین بۆ ئاسمان دەبا

پێچکەی گالیسکە
لە ناو فریز پەڵەکانی جەستەی
بەخوناوی شادومانی لادەدا
سەرنشینەکانی نقێمی ئەنگوستیلەیان چاون
لە کاتی دەسگیران هەڵبژاردندا
کە سروە و ڕشێنەی باران
پەرژینی دارین دەشکێنن
گوڵە جۆ و گەنم
لە ناوچەوانی کار و بەرخ شەپۆل دەدەن
ناز و فیزی شێر لەو کاتەدا گەرم دەبێ
کە تەرمی نێچیر لە ناو دەستەکانی
دەشێلێ و گۆشت و ئێسک لێک جیا دەکاتەوە
تەنیا مرۆڤ پێوبستی بەئاسوودەیی ناو ئاوێنەیە
دەزانێ کە ناشیرین بوو

ئیدی تەواو
ژیانیش بەردەوام خوان پڕ بەهرە و بەرهەم دەکات
بوێری باڵندە بەرز دەکاتەوە
ئەوانیش لە مەستی فڕینێکدا
ئاسمان خاڵی دەکەن لە برووسک و پاشماوەی
نەرم نەرم
لە ئاسۆی پڕی سپێدە دێنە خوارێ
بەسەر گۆچانی پیرەکان دەنیشنەوە
پیرەکانیش ترپەی لێدانی دڵی خۆیان
گرێ دەدەن بەباڵیانەوە
باڵ ئەی پشت و پەنا و جوامێری
ناو دانیشتنە تایبەتییەکان
ڕەوانبێژ و سەروا و کێشدارمکە
بەتکای گوڵەباخ لە دەست

خەریکە ڕووناکی لە چاوانم کۆنابێتەوە
ئەلفوبێی ژیانی خۆم
لە بەرزاییەکان هەڵدایە دەستی خواوەند
ڕەشنووسی بەخت و ناوچەوانیشم
دوور لە نزرگایەک شاردەوە
ئەی دەریای نووستووی خەونی خۆ ئاشکرا کردوو
بەرپا بووە زەبر و زەنگ و جەنگی جودایی
دەستەودامەن و فریا
جامی ئەفسووناوی گیانم
پڕکە لە ئەڤینی خودایی
مانگی لە دەست مەرگ هەڵاتوو
شانمی بە
قەڵا و مۆزەخانە و ئاوێنەی بنەماڵەی زانی
زمان و دڵی لەسەر پەروەردە بکا

تریفەیەک لە ناو جامی ئەفسووناوی خوا
برژانگی چاوە گەورەکانی کردنەوە
بە وریاییەوە دوا
دوای چەند چرکەیەکی خوماری
گەشتوگوزار و غەزەلی ئەسپ و بریقەی
چاوی پێغەمبەرەکان
لەسەر زەوی دەگۆڕێن
هەندێک زمان و دڵ پەیدا دەبن
سێبەریان ڕوونە
ئەرێ ڕوونی
زەبر و زەنگەکانی داهاتوو
لە پێناو چیدا دەبن بە جەنگ
کوکوختی هۆگر بەحەوشە و ماڵ
لە وشەی هەڵکەندراوی ناوچەوانی

خانووی باپیران دێنە دەرێ
لە ناو فەخفووری ماستی منداڵەکانمان
لە ڕەنج و ڕاز و هەوای بێباکی نقوم دەبن
دەست بە سەری ئاگرودوو
دادەهێنن و گەرمایی دەبەخشنەوە
بە ئەشق و پێوەندییە هەستییەکان
پاشان لەسەر ئالآی داگیراو پاشەڕۆ دەڕێژن
ئەرێ مانگ
لە زەماوەندی جاویدانی زمان و دڵ
چ شەربەتێک دەخورێتەوە
مەشخەڵی سەرشانم
فڕییە ناو چاوی پەپوولە
ئەو چاوە ڕەنگی خوای پاراست

**تشرینی دووەمی ۲۰۰۵ هەولێر**

## ڕێوڕەسمی کردنەوەی پەیکەرێک

خوا بەنیازی سڵاو
چاوی داوەتە دەستێک
دەبدەبەی ڕەنگاوڕەنگی پێوە بشەکێتەوە
قوماشی ڕەش و سپی بڕی
پیت ڕژانە ناو دەمم
توانیم وشە لێکدەم و داوا بکەم
مانگ بەسەر هەولێرەوە پرپێ
بەو نازەی داویەتییە ئاوی مەنگ
چەتر هەڵدا
پەیکەرێک حەفتا ساڵ

پیاسەی کردبوو
ئاوێنەی دابووە ژن و شووشە بۆنی وەرگرتبوو
سەیری پەند و وێنەی سەر قەڵغانی کردبوو
قسەی توندی لەگەڵ وەردیان کردبوو
نامەی لەسەر باڵی بە ناز و فیزی کۆلارە نووسیبوو
سەرسام بوو بەگوێی کەروێشک و گوارەی شۆڕ
بلووری لامپای سڕیبووەوە
تووتن و پایپی خۆش کردبوو
زۆر تەماشای
وێنەی دایک و باوکی خانەدانی کردبوون
پێوەندییەکانی نێوان
درەخت و باڵندەی باش ناسیبوو
گڕوگاڵ و دارە دارەی منداڵیی
دەبێتە کاروانسەرا

یەکەم هێلکە لەوێ دەشکێ
لە بریقەی خان و مانی ڕەش و سپی
ڕەنگەکانی دی لەودا
بەکامی دڵ سۆز و ئاوازی گیان
دەدا بە پاڵەوانی هیوا و فەرموودەکانمان
باڵندەی شادمانی هەمەجۆر لەشکری بوون
پەلکەزێڕینەش بیر و بۆچوونی
لەشکر کە دەرژێنە بڵندایی دەموچاوی
بەنیازی ناسکبوونەوەی
نیشتنەوە و بڕیاردان لەسەر مانەوە
بیردەکەنەوە و قسە و باس دەدرکێنن
کە ئێمە زۆر پێویستمانە بیزانین
گوڵەکانی لە ڕێوڕەسمی لە دایکبوون و مردنی
دەخرێنە سەر پەیکەری

تەنیان وەک تەڵە شقاتەی بەکارهاتوو
بۆ داگیرسانی مۆمی سێبووری
بولبول لە پاڵیان
بانگی ئەشق و نیانی جۆلانەی ون کردووە
دوای سەرگەرمی دیدارێک
گۆشەنشین و خەواڵوو
ماسوولکەی جەستەیان
دەمەتەقێی لەگەڵ هێز بەکۆتا دەگا
چێژ لە زوڵاڵی ئاو و خۆری
ڕوون و پاراو وەرناگرن
بەڵام خەیاڵ کە دووڕوویی مرداندووە
بێ بگرە و بەردە بەهەموو شتەکانی دەگەیەنێ
لە بۆنەی ئاشقبوونی شەونمی سەر گیا
دەبێتە دەستی وەفا

هەڵیدەداتە ناو ئاهەنگەکانی هاتوچوون
بیرەوەری سوودی پێ دەگەیەنێ
هەڵە و نوێژە درووێنەی لە بیر دەباتەوە
دەستێک لە گێڕانەوە ڕاستگۆ
نامەکانی دەخاتە پۆستە
نامە هاتووەکانیشی وەردەگرێت
ڕۆژی هەمیشە بۆنخۆش بەشەقبوونی خاک
کاتێک دومبەڵان خۆی دەناسێنێ
لێدەگەڕێ ئاقیق و نووسراوی ناوچەوانی
هەر هەموو پێغەمبەرەکان تێکەڵی بن
لە گەرمەی سەما و ناخ جریواندن
دڵی دەشوات و دەڕوا
پڕ دەستمان کلۆ شەکر و مۆری بەخت دەکات
دەتوانین

کەلوپەل و وێنەی بەهرەمەندەکانمان بکڕین
دەستەسڕی تەنکیش لەگەڵ خۆمان هەڵگرین
بێباکی بڵندبوونەوەی چنار
دەبێتە شوێنێک
وەک قۆزاخەی ئاوریشم
جوانکراو بەسپێنەی هێلکە
ئاسوودە و پڕ بەهرە و پەیماندار
هەموومان شەقامێکمان دەبێ تێیدا
بچینە سەردانی خزم و کەس و برادەرەکانمان
ڕۆژ کە ئاوا دەبێ
تەواو ئەڤینی خۆی کردووە

**کانوونی یەکەمی ٢٠٠٥ هەولێر**

## ڕژانی مووڕووی بەخت

گردێکی پەرژینکراو بەهونەری دەستنووسەکان
خوا هەمیشە
دانیشتنە تایبەتییەکانی تێدا ئەنجام دەدا
درەختی زمانیش بەگۆپکەی نەکراوە
لکی گران بوو
دەنگی پێغەمبەرەکانی لەوێ
یەک بەدوای یەک ئاوازدار کرد
دەستی بەڕوخساری سادەییماندا هێنا
مووڕووی بەختی ڕشت
دێوانەیەک لەسەر ناوچەوانی بڵندی

ئالآی ئاشقبوون و مشتومالّکردنی
یادداشتەکانی پیشان داین
بای بەزەبر و بێ پەرواشی ڕاهێنا
ئاراستەی تەواوی بخاتە سەر
بۆ شەکاندنەوەی بەردەوام و پێوانەکردنی
نازی چاوی هەڵۆ
چاوی لە گۆی سەیوان گڵۆپی ڕەنگاوڕەنگ بوون
سەروەری وەک سپێدەی ڕۆژی بەهار
چاکەی بۆ هەموو کەس دەوێ
گەنجینە و جوانی لە سێبەری
تەنکی کەلوویەک هەڵگرتەوە
پێش خۆی بەڕوونی بینی
زانی پێیەکانی لەسەر
کونی باڵەبان

تووڵەی شفتی
بڕکی گندۆرە
لاسکی لۆبیا
چێورمەی گۆڕ غەریب
قەڵەمکێشی ئەسپ
برینی قوربانی
مەتارەی شوان
قەڵەشی کوارگ
دانەنێ و گرەوەکانی کە باپیری لەگەڵ
نەوەکانی خۆی کردبوونی بباتەوە
سۆز و بەهرەی بەهێزی تێدایە بۆ ناسین
شوێنی حەسانەوە زۆرن
بەرامبەریشی تابووت
مرۆڤ بەدڵێکی خومار

چاویلکەی فڕێ دا و جوان خولیاکانی چاوی جێبەجێ کرد
هیواکانی لە ناو دانەنا
شەپکەی تابووتیش لە درەختیدا
گەشە ختووکەی سووری خوێنی داوە
ڕازاندوویەتیەوەش
تەمێک لە مەمکی دێو پەیدا بوو
بووە تانەی چاویلکە و پەنجەرە
دڕندە و بەخشندە
بەیەکەوە لەسەر زەوی نیشتەجێن
تەمەنی زەوی بەو نیشتەجێبوونە درێژ دەبێ
ماوەتەوە
ئاوێنە بەدیوارەکان هەڵبواسین
باڵندەی پەڕ چەور
ڕۆژانی پشوو لە گۆمەکان بێنە دەرێ

له ناوی بیر بکەنەوە و چرا و ئەلبووم
بهێننە سەر مێزی ژوورەکان
وەرزی نیشتنەوە و هەڵفڕین و توانای باڵیان بناسن
پاشان بەڕەنگی شاد و بیری هێمن و بێگەردەوە بنوون
نووستن فریای
ناخ و
گیان و
ویژدان و
خوێن دەکەوێ
له حەوشەی پشتەوەی
خانووە دێرینەکەی ماڵی باپیرم
کە بەهەشت حەزی دەکرد بۆ کاتییش بێت
چەند ڕۆژێک خەڵکی هەڵبژاردەی خۆی بهێنێ
بە نەخش و نیگاری خەریکیان بکات

هێشووە ترێیەک دەمی لە ناو کەپر
شۆڕکردووەتەوە ناو ئاوی ڕوونی کووپە
دەڵێن باڵندەی پەڕ چەور
هێلکەکانی دەهێنێتە ناو کتێبخانەی
ئەو شاعیرە سادەیەی
ئاوازی بۆ ئەم سەرزەمینە دانا
پەلەشی نەبوو لە پێگەیشتنی میوەکانی حەوشەی
بەدەستنووس و پرچی کیژەکانی دایدەپۆشێ
لە کوێ لاشەی مردوو
گیان گەڕایەوە ناوی
کێ چاکەکاری گیان چاندنەوە دەکات
ماسی بەناو جۆگەکاندا هاتن
بۆ سەردان و یارمەتیدانی ڕووبار
قولابی چاوداری ڕاوچییانی

سەر ئاو خست
پێنج پەنجەی دەستی ڕاستیش
سامان و سەروەری بۆ ئاشقبوون بەهێز دەکەن
وەک ئەوەی لە بوێرییەک
دەستی خۆشەویستێکی دوورە دەست بگوشێ
مرۆڤ بە شکۆ و خانەدانی و بوێرییەوە
ئاوی ڕژاو کۆبکەرەوە و ئاشق بە
بەهونەری دەستنووسەکانی خوا
ئەشق بەناوی خۆتەوە
بانگت دەکاتە ناو ڕووناکییەکانی پیت و ناولێنان

**کانوونی دووەمی ٢٠٠٦ هەولێر**

## کووپە لە مێوانداری ماسیدا

ئەرێ بۆ تەنیایی بۆ خۆی هەڵبژارد
دەست و پێوەندەکانیشی بەناو خەڵک هەڵوەدا
پێیەکانی لە ئاوی لێڵ تەڕن
گیانی پەرێشان
نوێژ و ستایش و پاڕانەوە
یارمەتی دەروونین
بەتوندوتیژی و زەبر
داوای یارمەتی
لە ناسراو و دەستوپێی کردوون
باڵندەی قاچ ڕووت و دەنووک درێژ

باڵەکانیان دەخورێن و داوای باجیان لێ کردووە
جەنگ لەو پێناوەدا هاژەی هات
لاشە کەفی هەڵدا
لاشەش ئاوێنەیەکی پەڵەداری پێشکێش کرد
باڵندەی تەمەن کورت ببینێ
لە پشتی خۆشی هیچ لە دایک نابێ
تەپەدۆری لە پەنجەرەی بیستن ناوە
داویشی لەسەر کورسی
شەیتان و فریشتە داناوەتەوە
کتێبی نائومێدی لەم چاویەوە گواستووەتەوە ئەو چاو
ڕەوانبێژ و
هەواڵدز و
خۆویست و
خۆشدووە

تەمەنی بەشی ئەوە دەکات
لە هەموو شەقامەکان بپەڕێتەوە
مردنی پەنجەی کەمانچەژەنەکانیش ببینێ
بەئاگرم مەسپێرە
پشت و پەنایەکم هەیە
هەمیشە بەبیر خۆمی دەهێنمەوە
جوانی مەحاڵ دەهێنێتە دی
کارتی جەژنانە فڕێ دەداتە ماڵەکانمان
وێنەی کێکی مۆم لەسەر داگیرساویش
دەگرێ و بەیادگاری دەیداتە نەوەکانمان
وەک شاعیرێکی دەموچاو درەوشاوەی بەختیار
چوارخشتەکی لەسەر شیعری باوکی نووسیوە
غەزەلیش چاوی بە پەڕپەڕەی مانگەوە هەڵواسی
لە پێچی شەقامێکدا ونی کرد

پێنج خشتەکی و بەهرە وەرگرتنیشی مایەوە
چرای هۆگربوونی بەدەستەوەیە
بەدوای لەپکە شینەی دیاری داپیری
چاوی دەڕوا و دەگەڕێتەوە
هێزی چاو بەشی
شکانی لەشکری هەڵپەدار دەکا
ڕۆژنامەنووسی بەرەکانی شەڕ
بۆ ماوەیەکی کورت
لە خۆشییاندا لە هۆش خۆ دەچێ
شیعرێکی ڕۆمانسی دەموچاوی ئاوپژێن دەکا
مۆم و شقاتەی لە دەم دەڕژێ
گیانی زیو و ئاوریشم و فەنەر لە ناوی
مردوویەکە ئاگای لە هەمووان
لەسەرخۆتر بەرەو لام وەرە ئەی پیری

بلیتی سواربوونی چەرخ و فەلەک
هێشتان سووڕی  خۆی تەواو نەکردووە
بۆنی ڕازیانە و نان ڕشاندنی دایکیشم
هێلکەم دەترووکێنن
سەمەندەر برای شیریم بوو
دوای ماوەیەک پێکەوە ژیان
هاتە ناو خوێنم و ئێسکمی توند کرد
باڵندە بەناو خۆر بڵند بووەوە
ئەرێ باڵندە بەئاسمانەوە چیت پێ دەڵێ
میوە ڕوومەتیان بەناز و شکۆوە هەڵدەخەن
ڕێبوارانیش بۆینباخی قاوەیی
بەسەر کراسیان شۆڕ دەکەنەوە
شەپقەی خوربیان دادەنێن
ماست و زەیتوون و کەرە و هەنجیری وشککراوە

لە ناو سینی چینکۆ شەڕیانە لەگەڵ لێوی بە بار
شەڕ بە تاو هات
ئەو مردووەی ئاگای لە هەمووانە
لە ناو شووشەی مەرەکەب
یەکەم شت کە بینی ڕستەیەکە
بۆ گیان و دیوان دەدوێ
ئەرێ گوڵ بۆ
هاوسەروای دڵ و کول و بولبولە
ماسی بەناو ئەڵقەی نارنجۆک
خۆی سپاردە کووپەی ماڵی من
کووپە و ماڵی
هۆگر بە فڕین و بۆنی خەنە و مێخەک
گوڵەبەڕۆژەی نیگا ئاڵاو بەپەیمانی نەمری پاسەوانیەتی
بەرامبەر قسە و هەڵەوەڕی و دەمهەڵبەستی

شارێک چاو ناترووکێنێ
درەوشانەوەیەک لە دەموچاومدا
بەهرەمەندی کردم بە هێز و خۆبوونی خودایی
خۆر ڕووی خۆی بۆ ڕاگرتم پێویستییەکانمی تێدا بنووسم
دەستنوێژ دەگرم و خۆم تەنیا بۆ خۆم
چاوم لە نەخشە نقوم دەکەم و باخچە بەسەر ماڵان دابەش دەکەم
پێش چوونە گەشت خەون وریام دەکاتەوە
کێ دەبینم و ئاو بەدەموچاوی کێ بپژێنم
لە ناو شووشەبەندیش گوێ لە گۆرانی نەگرم
پارچە قوماشێکی خنکێنەر بەسەر زایەڵە دادەکێشێ
زایەڵە سەرەتای هەموو شتەکانە
بەخانومانی بەرەو ئێرە دێ
حیکایەت بۆ باپیرەی سەمەندەرمان بکات

**ئاداری ٢٠٠٦ هەولێر**

## سووڕی پاراوبوونی بۆن

پەری بە بەخششی زەردەخەنەی
خۆی دەکات بە ناسیار و بەهەشت
دەهێنێتە سەر سینییەکی مسین
تەمەنی ئالەکۆکیش بەشی
شەڕی مانەوە لەگەڵ ژیان دەکا
تەم لەسەر هێڵکارییە سەرەتاییەکان لادەدا
وێنای هەفتەیەکی پڕ جموجووڵ و دەستنووسم دەداتێ
سەرەتای لەناو دروست بکەم
چەکەرەی زەمینیم و گوێشم
لە ئاواز و ئاهەنگی بەهرە و سرووشە

بەهرە و سرووش ئاهەنگیان لەماڵی دڵە
دیوار و تاق و پەنجەرەی ماڵی دڵ
شێوە و شکۆیان داوە بە کتێبی ڕاز
سروەیەک بەسە بۆ گەشبوونەوەی چرا و خوان گەرمبوونی
چ دەدۆزمەوە ئەی کڵاو و گۆچان و خۆزگەی هەڵۆ
درەخت لە دڵەوە دوا سەمای دەکرد
لک و پۆپی سەرگەرم بەیاداشتی خانەوادەی
ڕەنگی سەوزێکی پاراوبێ
بۆن و شیلەش بەسەر زەویدا بڕێژێ
پاشان لە قۆزاخەی ئاوریشمدا
سووڕی مانەوەی تەواو بکات و بەر جەستەمان بکەوێ
لە بەخت و بینینمان بیکاتە شاخی کەڵەکێوی
ناوچەوانی بەردی پێبهەڵواسین
گڕوگاڵی گزنگ و زەردەپەڕ

لاپەڕە نووستووەکانی هەڵدەنەوە
بەرد ئێسکی زەوییە
نیشانەی سەرسامییەک لە ناو چاوی بریسکەی دا
ڕەزێکی گیان پەڕەکراو
کە دەستی لەسەر دڵی لاچووە
گۆپکە کەم هۆگرن بە لکەکانی
گەڵاپیتێنیش تێیدا سارد و سڕ
ناوی میوەکانی خۆشی لەیادکردووە
بەڵام گەشە لێوی بەخێر جووڵاون
هەمیشە خۆیان بەبیر دەهێننەوە
دەکەونە بیرکردنەوەش
ئەگەر ئارەزووی گۆرانی گوتنم هەبێ
دەتوانم بیڵێم
ڕەنگەکان لە دەروون دەهێنم

بەرزیان دەکەمەوە تا ئاستی سەر
لە ئاستی سەرم شاری یەزدان
دەردەکەوێ و دەبێتە ئەو شوێنە
بەهرەمەندیان خانووی
لە دەفتەری یاداشت و گوێچکە ماسی دروستکراوە
کاتژمێری ناوەندی شار لێی دا
سمۆرە
باڵندە
مرۆڤ
بەرەو ئێرە
پێ و باڵ و چاویان کردەوە
تەپوتۆز تێیان ئاڵا
لەم حاڵ و بارەدا بزردەبن یان
سەریان لەناو زەرفی نامەیەکدا

بەلێوی منداڵ بە مەمەی شیرەوە داخراوە
دایک و باوکیش
لە نووسینەوەی ڕێگا نەبوونەتەوە
ڕێگای دیکەش
بەلێوی تەڕ و جوانەوە بەرەو ڕوویان دێن
نووسینیشیان هەمووی دەبن بە
ئەشقی خودایی و دێنە دڵ و چاومانەوە
وشەکانی ناو فەرهەنگ
بەشی نووسینەوەی ڕێگا ناکەن
پەپوولە بەسەر تەرمەوە نیشتوون
ئارەقەی بن باڵیان
ئاسوودەیی دوای گەشت و بۆنی نەگەچڵانە
لە هەموو شوێنێک ئامادەیە خۆشەویستی
دەتوانم لەسەرە ڕێگاکان بوەستم

فەرامۆشیشی بکەم
بەڵام سەرمام دەبێ
چاوێکی تا هەتایەی لە ناوچەوانم بەهێزکردووە
خۆشەویستی
یاداشتی هەمووشمانە
لە ناوچەوانی تەڕی خانووەکانمان
شەوقێکی بێ پەروایە
هەمیشە لێمان نزیکە
لە دەنگی نەرمی قورینگ دەگەڕێ
بەهۆیەوە بێتە ناو دڵمانەوە
بەگەیشتنی درەختی ناو شەقامەکانی شار
ڕەنگیان پاراو دەبێ
ئەرێ بۆ بەس خودا دەزانێ بەهەشت لە کوێیە
خودا پیاڵەی منی پڕ کردووە

دایک و باوکم و دایک و باوکیان
چرا و شەربەیان لە سێبەری قەڵا بۆ دانام
سێبەر گەورە بوو
خۆشی هێنا ناو خۆی و ڕازی درکاند
بە ئارامی کۆترێک بیر لە قوربانی بکەرەوە
قەڵا تاجی سەری بە ئومێدی چرادان
هەڵدایە سەر شووشەی ڕوونی چاویلکەکەم
لە بری ئاسۆی کوڵمە پڕ دەماری چالاک
خۆر تەنیایی خۆی تێدا دەتوێنێتەوە
یاداشتی شارێک
کە سڵاو لە ئەستێرەی هەڵاتوو وەردەگرێتەوە
لە کەڵ ژیانیدا نووسرا و مەدالیای
جوانی دەدوێنی بەسینگیەوەیە
هەولێر دانەوێڵە و میوە و ئاوی بۆ هەمووان هەیە

کراسی بابە نوئێلی بۆ ڕادەگرین تا بەتەواوی دڵ
هەڵیدەبژێرێ و لەبەر هەموومانی دەکا
فڕین بەباڵ و پێ و دڵ
خۆری مەزەدارە پڕ بە ئاسمان وچان دەگرێ
ئاسمان چ جوانی و خۆشەویستییەکی تێدایە
دێتە ناو هەستەکانمانەوە
هەڵفڕیوێک خۆشحاڵ و مەستی
ناو زایەڵە و ڕووناکی زەماوەندی پەرییانە
لەتەک مانگ دادەبەزێ
دەچێتە ماڵی ئاسوودەیی
ئەرێ دەرگای ماڵی ئاسوودەیی کلیلی
فلچەی هونەرمەندە یان پووشی ناو دەنووکی باڵندە
تاووس سیمینارێک دەربارەی جەژنی شارێک دەگێڕێ
کە کراسی لەبەر هەموومانە

لەناو کتێبخانە خوێن خەست و خۆڵەکەم
پیاوە داناکانی شتەکان وەک خۆیان دەهێڵنەوە
قۆپچەی کراسیان کردووەتەوە
لە کۆشکەکانیان هاتوونەتە دەرێ
دەست بە چەقۆ دەمە بۆڵەیانە
ڕەنگەکان بریقەیان پێچایەوە
بە پەلە و هەڵەداوان
ئەم دەوروبەرەیان کردە ئەفسانەیەکی واقوڕماو
هیچی لێ بەدەرنەکەوێ
جەماوەر و ناوبژیوانیش تەنیا منم
مەلوول و جەرگسووتاو
لەسەر بەردێکی خاڵخاڵ
کە پێشتر پێغەمبەر لەسەری
زۆر تەماشای گەردەنی ئاسۆی کردبوو

دانیشتووم و هاواری ناوی خودا دەکەم
دەنووکی سووری باڵندە
یارمەتیم دەدا و لاپەڕە نووستووەکانم بۆ هەڵدەداتەوە
ژنێکی خانومان و حەکیمی قەتارچییان
کووپێک شیری لەدەستی ڕوونی چارەنووس
بە خەڵات وەرگرتووە
لە دڵنیاییدا دێت و دەچێ
پیتەکانی ڕێگا و تاسەی دیدار
جوانتر دەبنە وشە و ڕستەی خورپەدار
ڕەز گوێ لە دەنگ و ئاوازی پەرییان دەگرێ
ئەوجا بەری ئاشق دەبێ و بۆن و شیلە دەڕێژێ
ئاو و باخم ڕوون بوونەوە
دڵۆپێک خوێن لە دەنووکی هەڵۆ تکا
ئەو دڵۆپە

ژوور و بەرژوورێکی لێ ڕسکا
لە بلوور و چاو
نازی دەرگا
کردنەوە و لێدانی کاتژمێر و لە ناز نەکەوتنی
تەندوورێکی بۆ خانومانانی شار ئاگر دا
وشەکانی کردە ئاردی گەنمەشامی
زایەڵەی دەنگی ئەو ماڵانەی دەموچاویان باخن
لە دەمارە هەستیارەکانی مەمکی
خانومان و حەکیمی قەتارچییان
تێر شیر و هەنگوین بوویت و چاوت بەرز هەڵێنا
ڕەچەڵەکی یەک لەدوای یەکی
پێغەمبەرەکانت ناسی
ئەو تاجبەخشە ئازایە
ڕەچەڵەکی پێغەمبەران بناسێ

چی تفری تەنک و ئەستوور هەیە
لە زمانت لایدە
شێرەی ئاو
بە زمان جوان دانانە ناو جۆگە جەزبەدارە
منی تاجبەخش و عەودالّی
با و
ئاگر و
خۆڵ و
ئاو و
ئەشق
خودا نیشانەیەکی دەروونی خۆی پێشکێش کردم
خەم لە ئەستێرە هەڵاتووەکانم بخۆم و لێیان بدوێم
دڵۆپێک خوێن لە دەنووکی هەڵۆ تکا
ئەو دڵۆپە

ژوور و بەرژوورێکی دامێ لەماڵی ئاسوودەیی
شاعیران بەناو کلاورۆژنەیدا هاتن
سەبەتەیەک گوڵی گیان و سەروا و کێشیان
بەدەستەوە بوو
نان و ئاوم لەگەڵ بەش کردن
پاشان بەهرە و سرووش

**تشرینی دووەمی ٢٠٠٦ هەولێر**

## ئاهەنگی ناولێنانی درەختێک

ڕۆژ خۆر لە دایک دەبێ
شەویش مانگ
گەنجینەی ئومێد و ئەشقی درێژخایەن لە دەروون
دەروون ئەی دەفتەری یەکەم پڕشنگ هاوێشتن
سەرڕێژ لە ڕاز و بۆنی خۆشی
خودا و دەنگی لاواندنەوە
زەوییەکی بێ هاوتا و پاراو و سرووشدەریت
هەموو ڕووزەردەکان دەبەزێنی
کێ ئاماژەیەک بۆ ئەوە دەکا
ئێرە هەوای بە پیتە
پڕ دیوان و بادەی هەنگوینیش

ئەو خانووەی منداڵەکانم بە تەمان
تاجداری بکەن
لە چاوانیان بئافرێنن و بیکەن بە بەرهەمی جوانییان
بە نەرمەغار جارێک بەدەوریدا سوورِامەوە
ئەسپەکەم کەوتە ناو خۆرەتاوێکی سەرگەردانەوە
کەلوپەل و بەرد و بناغەی
دەبن بە تیپی مۆسیقا و کۆرسی گۆرانی منداڵەکانم
لە گۆرانیدا پشووی خێزانیی بەرپا دەبێ
بازاڕی گەورەی پڕ شتومەک و پێویستی
دار هەنجیریش ڕەگی لە سرکە لادەدا
باڵندەیەکی چاوڕەش کە باڵی موتوربە بوو لە
گیای سەر گۆڕی قوربانی و
دەمودووی سلاو کاتێ دەبێتە خۆشەویستی و
لۆکەی ناو کورتەکی دایکم و
برۆی پێغەمبەر و

چاوی باپیرانم
لە پەنجەرەی ماڵی من باڵی ڕاگرت
بیری زۆر هێنا و برد
ڕەنگی تێکەڵ بە
شینایی دەریا و ئاسمان کرد
بەخشندانە خێزانەکەمی هاوێشتە ناو گلێنەی
چۆن سۆبەکە گەرم دەکا
منداڵەکانم کاتێک دەنکە قاوە لە ئاون دەکوتن
زرینگانەوەی کلیلە هەڵدەدرێتە دەستمان
دەمەوێ بیهێنمە ناو شکۆی قاسپەی کەوێکەوە
لە قاسپەدا داوای خۆی لە ڕوو دەڵێ
چەند
وزەی تیشک و
ئاو و
خۆڵ و

پەروەردەی دەوێ
بۆ گەشە و بەهێزبوونی چاوی
باڵندەی چاوڕەش هەر زۆر لێمانەوە نزیکە
بە لکێک لە درەختی بنەماڵەکەمانەوە نیشتووەتەوە
قەت جێمان ناهێڵێ
تابلۆی ڕاڕەو لە سڕینەوەیدا
ئاوازی بۆ گوتراوە
لەناو ڕووناکی هاتوچۆکەران
ڕەنگەکانی پڕ بە چاو پڕشنگ دەدەن
ئاوازی باڵی مراوی کێوی دەکات بە
برادەری ڕێگای دوور و نمەکدار
لە ئارەزووەکانمان بدوێ
ڕاڕەوەکەش لێوڕێژە لە دەنگی
ئەوە ئێستا دەژیم و خەم دەخۆم
شێوەکارێک تابلۆکانی خۆی

دەهێنێتە بازاڕێکی نزیکە دەستەوە
ئێمە دێینە باخچەی ماڵەکەمان
باران دەست بە ڕەنگ و ڕووی زەوی
دادەهێنێ و دەیلاوێنێتەوە
درەختێک بەناوی منداڵەکانمەوە دەچێنێ
ڕەگ و چرۆی دێتەوە ناوچەوانمان
ئەی لای چەپی سینگم
بۆن بە کام گوڵی پێشکێش کراوتان دەکەن
درەخت لە جیاتی ئێمە دەژی
هەزاران شت دەدۆزینەوە
بە گەنجبوونەوەش
دروود بۆ درەختێک
گیانمی فێری گیانبینین کرد
گیانم چەند ڕووناکی منداڵەکانمی تێدایە
گوێڕایەڵی ڕووناکیم و دەستم بۆی درێژ کردووە

نیازی دڵی خۆمم بۆ هەڵڕشت
گوتی خۆشەویستی لە بەرزی ڕوانینە
لە ماڵەکەی خۆتدا
ژوور و هەیوانێکم بۆ دانێ ئەی خوا
ئەو کتێبانەی لەبەر نازی پەلکەزێڕینە
ڕستەکانیم هێڵ بەژێردا کێشاون
ئالآی بەختن لە سەکۆی ماڵ هەڵدراون
ئەوانەی نەشم خوێندوونەتەوە
ئاگرودوویان لەناو چاوم
تریفەی مانگی سەرگۆمێکی بەستووە
غافڵمان ناکا لە شینایی دەریا و ئاسمان
ڕووگەنمای ئەشق ڕوو لە شینایی دەوەستێ
ئاکام پەیدا دەبێ و ڕووناکییەکانی ماڵ دەناسێ
دوو دەست هێزیان لە زەردەی ئێوارە بوو

پەیژەیەکی داریان لە حەوشە دانا
کێشی هەموو ئەندامی خێزانەکە دەزانێت
بۆ ئەوەی تەماشای گەشەی منداڵەکانم بکەم
دەبێ خرۆشی قەتماغەی برین
بەڕوومەتی لایەک هەنار و لایەک سێوی
زەوی بچووێنم
با کەس نەزانێ هەنار و سێوی زەوی ڕژاوە
دەنگەکانی دەروونمان نەنیشنەوە
نیشتنەوە وشکبوونی دەماری سەرە
لەبەر خۆرێکی سەرگەردان
لە نێوان قڕەی قەلەڕەش و جریوەی هەڵخەڵەتێنەری
ئەستێرەی کاروانکوژە
بۆنی بەهار و چرای وچان و خولیای
پەپوولەوانی پڕ تاسە و دلۆڤان لە کوێیە
ئەی هێڵی ناو دەست و دوا نهێنی دیوانی خامۆش

**کانوونی یەکەمی ٢٠٠٦ هەولێر**

## ناوەرۆک

## چاپکراوەکان

١- زێوان، ١٩٨٨.
٢- ڕووەکەکانی خواوەند، ١٩٩٩.
٣- خەون وا خۆی گێڕایەوە، ٢٠٠٤.
٤- شەڕی چل ساڵە، ٢٠٠٥.
٥- مردوویەک ئاگای لە هەمووانە، ٢٠٠٧.